







www.ksc-kcf.org
www.khak.org
pepule1992@yahoo.com
pepule1992@hotmail.com

# ساڵی نوێتان پیرۆز بێت







گۆڤارێکی رۆشنبیری پەروەردەیی منداڵانە، منداڵپارێزی کوردستان لە سلێمانی دەریدەکات. ژمارە (١٧٠) - ٢١ی کانونی یەکەمی ٢٠١١ پەپوولە لە بەهاری ١٩٩٢ دا دەرچووە



منداڵپارێزی کوردستان
Kurdistan Save the Children Children's Fund

# چرپەی داپیرە





### سوپاس بۆ هاوکاریتان:

خۆشەویستان، کاتێک لــــە بەهاری ساڵی ( ١٩٩١ ) دا یــەکەم ژمارەی گـۆڤاری پەپوولە ئامادەکرا بۆ چاپ، لــەبەر ئەوەی لەو کاتەدا چاپخانە لە کــــوردستاندا نــەبوو، لە دەرەوەی کــــوردستان چاپکرا، بەڵام بەهۆی بــــارودۆخی ئەو کاتەوە، نەهێڵرا بە چاپکراوی بهێنرێتەوە کوردســـــتان. ئێستا بە نیازین ئەو ژمارەیە دەقاودەق وەک خۆی چاپ بکەینەوە. هیوادارین هەر بەرێزێک ئەو ژمارەیەی لا دەست دەکـــەوێت، بیگەیەنێتە دەستمان تا بتوانین جارێکی تر چاپی بکەینەوە.
سوپاس بۆ هاوکاریتان.
گۆڤاری پەپوولە

بە بۆنەی سەری ساڵی نوێوە، لەگەڵ چەند ماڵە دراوسێیەکدا لە مـاڵی خۆمان کۆببوینەوە. شـــەوێکی زۆر خۆش بوو، قـــاقای مـنداڵەکان دڵی هـەموومانی خۆشـــکردبوو. بەجلی ئاڵاو واڵاوە هەر ئەهاتن و ئەچوون و چاوەڕێ بوون نمنمیش خۆی بگۆڕێت و ئاهەنگەکەیان دەستپێبکەن. هێندەی نەبرد نمنمیش بـــە جلێکی جـــوانەوە پەیدا بوو. کاڵێ بە سەرسورمانەوە لێیپرسی: ئەیلەوە، ئـــەی جلە کوردییە تازەکەت بۆ لەبەر نەکرد؟! خۆ ئەو لە هەموویان جوانترە! نمنم وتی: ئاخر ئەزانم لە هەموویان جوانترە، بۆیە لەبەرم نەکرد! بـــاوان دایە قـــاقای پێکەنین و وتی: ســـــەیرە، لەبەر جوانییەکەی لەبەرت نەکردووە؟! نمنم وەڵامی دایەوە: ئـــــەو جلانەم بۆ بۆنەیەکی زۆر خۆشەویست کریوە! کاڵێ وتی: کەواتە لای تۆ بابەنوئێل و جەژنی سەری ساڵ خۆشەویست نین؟! نمنم بە خەندەیەکەوە پێی وتن: من ئەوانم خۆش ئەوێن، بـــەڵام بابە نەورۆزو جەژنی نەورۆزم خۆشتر ئەوێن! ئەو جلانەشم هەر بۆ نەورۆز کریوە.

سەرنووسەر

پەپوولە: گۆڤارێکی رۆشنبیریی، پەروەردەیی منداڵانە. خاوەن ئیمتیاز: هـێرۆ ئیبـراهیم ئەحمەد. سەرنووسەر: یاسین قادر زرگوێزی. دەستەی نووسەران: نەریمان عوسمان، ئەحمەد محەمەد. هونەریی: غەمگین فەتاح. دیزاین: سەرخێل شێخ مەهدی. پەپوولە مانگی جارێک لە سلێمانی لەلایەن منداڵپارێزی کوردستانەوە بە تیراژی ( پێنج هەزار ) دانە بڵاودەکرێتەوە و چاپکردنی لە چاپخانەی پیرەمێردە ، دابەشکردن: کۆمپانیای نێوەند
ناونیشان: کوردستان– سلێمانی– منداڵپارێزی کوردستان.تەلەفۆن ( ٣٣٠١٠٤٢)،( ٣٣٠١٠٤٣)،( ٣٣٠٠٨٦٠)،( ٣٣٠١٠٤٦)،( ٠٧٧٠١٥٢٢٧١٨)
لە بەرواری( ٢٠١٠/١/٢٨ )دا ژمارە متمانەی ( ٣٢ ) ی لە سەندیکای رۆژنامە نووسانی کوردستان وەرگرتووە.

PAPOOLA: MONTHLY CULTURAL& EDUCATIONAL CHILD MAGAZINE. ISSUED BY: KURDISTAN SAVE THE CHILDREN.
NO.170 - December .2011, Internet: www.khak.org & www.ksc-kcf.org - E-mail: pepule1992@yahoo.com.

# هۆنراوە

وێنە: ئیسماعیل عومەر حەسەن

## بابە نوئێل





ئەمین محەمەد

بابە نوئێل، منیش ماوم
بۆ دیاریت بۆ نەهێناوم
چاوەڕێم وەک هەر منالێ
بۆ دیاریی تۆ، هەموو سالێ
کەچی تۆش سەرت سوڕماوە
دەلێی دیاریم پێ نەماوە
ورد گەڕاوم لەسەر نەخشە
تۆم نەبینیوە بمبەخشە!
ولاتی تۆ ناوی چییە؟
ئەی بۆ ناونیشانی نییە؟
بابە نوئێل گوێ بگرە لێم
تا پێت بلێم کێم و لە کوێم
کوردم، خەلکی کوردستانم
دابەشی سەر ولاتانم
ئەمشەو نانوم، چاوەڕێی تۆم
پێم خۆشە دیاریی بێنی بۆم

## کۆلارە



بەکر پشدەری

پارەی ڕۆژانەکەی خۆم
دادە کۆیکردەوە بۆم
یەک کۆلارەم پێکری
زوو بۆ ئاسمان هەلفڕی
بۆیە زۆرم خۆشدەوێ
بۆ ئاسمان سەردەکەوێ
تا بەرزتر بێتەوە
بچووکتر دەبێتەوە
دەزووەکەی لە دەستمایە
چەند جوان و پڕ بەهایە
ئای چەند بەرز بۆتەوە
هەور لێی کۆبۆتەوە
ئاخ دەزوم پێ نەماوە
لەو ئاستەدا وەستاوە

## تابلۆی پەپوولەو گول



پۆلێک پەپوولەی ڕەنگین
سەرنجیان ڕاکێشاوم
ماچی گولەکان دەکەن
زۆر جوانن لەبەر چاوم

حەزناکەم جێیان بێلم
وەکو تابلۆ ڕازاوەن
هێندە دلگیرن لەلام
دەلێی بوکی ئەو ناوەن

منی بچکۆلەو مندال
وا بەرەو پیریان دەڕۆم
چونکە ناسک و جوانن
دەیانکەم بە هاوڕێی خۆم

# گۆرەوییەکانی ڤینا

و: لە عەرەبییەوە: سەرهەنگ عەبدولڕەحمان.
وێنە: سەرتیپ فەتاح



دایکی ڤینا وتی: دەی ڤینا گیان، خۆت ئامادەکە دەچین بۆ ماڵی باپیرت. ڤینا سەرگەرمی یاریکردن بوو. بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بوو، وتی: ئەی گیان. هەر ئێستا خۆم ئامادە دەکەم. بە پەلە خۆی گۆری، ئنجا رایکرد گۆرەوییەکانی لەپێ بکات، بەڵام گۆرەوییەکانی دیار نەبوو. سەر مێزی نوسینەکەی گەڕا، بەڵام گۆرەوییەکانی نەدۆزییەوە. سەیری ژێر جێگەی نوستنەکەی کرد، لەوێش نەبوو. سەبەتەی یارییەکانیشی هەڵڕشت، هەر نەیدۆزیەوە.



دایکی لە بەر دەرگەی دەرەوە چاوەڕێی دەکرد، بانگی کرد: کچم ڤینا، ئەوە هەر ئامادەنەبووی. دەست و بردکە، چاوەڕێتم. ڤینا وتی: چیبکەم، گۆرەوییەکانم دیارنییە. هەموو ژوورەکەم پەرشوبڵاو کردۆتەوە. ژێر جێگەی نوستنەکەم، سەر مێزی نوسینەکەم، ناو سەبەتەی یارییەکانم و پشت دەرگەکەش گەڕام، هەر بۆم نادۆزرێتەوە. دایکی لە دۆڵابەکەی ڤینا نزیک بۆوە، چەکمەجەکەی راکێشاو ئاماژەی بۆ گۆرەوییەکانی کردو وتی: ئەوەتا کچم. ڤینا لە دڵی خۆیدا وتی

" دایکم بەبێ گەڕان دۆزییەوە، کەواتە هەر خۆشی هەڵیگرتووە. چەند شەرمە..گۆرەوییەکان هی منە، کەچی دایکم بۆم هەڵگرێ و هەر خۆشی بۆم بدۆزێتەوە. مەرج بێ نەهێڵم ئەمە دووبارە بێتەوە"

# ناوداران



# خاتوو دانیال میتران

لە ساڵی ( ١٩٢٤ ) دا لە شارۆچکەی ( ڤێردن ) لە فەرەنسا لەدایکبووە. لە جەنگی جیهانی دووەمداو لە تەمەنی ( ١٧ ) ساڵیدا پەیوەندی کردووە بە شۆڕشگێڕانی وڵاتەکەیەوەو دژی نازییەکان خەباتی کردووە. پاش سەربەخۆیی وڵاتەکەی، لە ساڵی ( ١٩٤٤ ) دا لەگەڵ ( فرانسۆ میتران ) کە دواتر بۆتە سەرۆکی فەرەنسا خێزانی پێکهێناوە.لە ساڵی ( ١٩٨٦ ) دا بە مەبەستی یارمەتیدانی گەلانی لێقەوماو، رێکخراوێکی خێرخوازی بە ناوی ( فەرەنسای ئازاد ) دامەزراندووە. ئەم خاتوونە هەمیشە پاڵپشتی گەلی کورد بووەو داکۆکیی لە مافەکانی کردووە. چەند جارێک سەردانی هەرێمی کوردستانی کردووەو لە ساڵی ( ٢٠٠٩ ) دا لەناو هۆڵی پەرلەمانی کوردستاندا وتویەتی " کوردستان وڵاتی منە " بۆیە وەک خۆشەویستی و رێزگرتن، ئەم شێرە ژنە لەناو گەلەکەماندا بە ( دایکی کورد ) ناسراوە. بە داخەوە لە ( ٢٢/ ١١/ ٢٠١١) بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

# هەمەڕەنگ

## بارانپێو

دەزگایەکە بۆ پێوانی باران بەکاردەهێنرێت. سادەترین جۆری پێکهاتووە لە لولەیەکی کانزایی یان پلاستیکی. بەشی سەرەوەی لولەکە رەحەتیەکی پێوەیە کە تیرەی دەمەکەی دەگاتە ( ٢٠٠ ) ملیمەترەو بەستراوە بە لولەیەکی ناوخۆییەوە کە پێی دەوترێت بۆری پێوانە. بۆری پێوانە روبەری بنکەکەی یەک لەسەر دەی ( ١٠/١ ) ی روبەری دەمی رەحەتیەکەیەو راستەیەکی پێوەیە بۆ پێوانی بری بارانەکە. هەندێ دەزگای بارانپێو هەن کە ئۆتۆماتیکی کاردەکەن، لەوانە دەزگای فیرگەسن و دەزگای سەتڵی هەڵڕێژە.



## روبە هەنار

پاش پێگەیشتنی هەنار، لە مانگەکانی ( ٩-١٠ ) دا هەنارە ترشەکان لێدەکرێنەوەو دوای شۆردنەوەیان دەوەرێندرێن ( دەکرێن بە دەنک ). پاشان دەنکەکان دەگوشرێن و دواتر گوشراوەکە لە هێڵەک دەدرێت و لە مەنجەڵێکدا دەکوڵێنرێت تا بەتەواوەتی خەست دەبێتەوەو دەبێتە روبە هەنار. روبە هەنار لە دروستکردنی خواردندا بەکاردەهێنرێت و لەگەڵ شەکردا وەکو شەربەتیش دەخورێتەوە. هەروەها بۆ چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی وەک فشاری خوێن و شەکرە بەکاردەهێنرێت. روبە هەنار لە زۆر ناوچەی کوردستاندا دروستدەکرێت.





ئا: دیاری

# ئارۆز و دارشەق



رۆژێک ئارۆز لەسەر شەقامەکە یاریی تۆپێنی دەکرد. لە ناکاو تۆپەکە دوورکەوتەوە بۆ ناوەڕاستی شەقامەکە. ئارۆز بە پەلە ڕایکرد تا بیگرێتەوە، لەو کاتەدا قاچی کەوتە سەر تویکڵە مۆزێک کە بە هەڵە لەسەر شەقامەکە فڕێدرابوو، ئیتر بە توندی کەوت بە زەویداو قاچی شکا.



دەبوو ئارۆز بۆ هاتوچۆی قوتابخانە دارشەق بەکاربهێنێت. ئەو حەزی لە دارشەق نەبوو، تەنانەت ئەوەندە لێی بەقین بوو چەند جارێک هەوڵی دا بیشکێنێ، بەڵام دارشەقەکە بەهێزبوو، نەدەشکا. دارشەقەکە لەو ڕەفتارەی ئارۆز زۆر نیگەران بوو، بەڵام ئارۆزی خۆشدەویست و دەیویست هاوکاریی بکات تا چاک دەبێتەوە، پاشان بچێت بۆ هاوکاریی منداڵێکی تر کە پێویستی پێبێ.



دارشەقەکە چاک دەیزانی کە ئارۆز بێ هاوکاریی ئەم ناتوانێ بڕوات، بۆیە بەرگەی کردارە توندەکانی ئارۆزی دەگرت و هەمیشە پێی دەوت کە هاوکاریی دەکات و لەگەڵیدا دەبێت تا چاک دەبێتەوە، ئنجا دەڕوات، بەڵام ئارۆز نرخی دارشەقەکەی نەدەزانی، بۆیە بڕیاری دا کە فڕێیبداتە ناو گۆماوەکەی نزیک ماڵیان. ئارۆ وای دەزانی بەم ڕێگایە لە دارشەقەکە رزگاری دەبێت.



ئارۆز لەم بیرکردنەوەیەدا بوو کە گوێی لە هاوارێک بوو. بینی خەڵکێکی زۆر رادەکەن بۆلای گۆماوەکە. کاتێک زانی منداڵێکی بچووک کەوتۆتە گۆمەکەوەو کەس ناتوانێ یارمەتی بدات، بەپەلە دارشەقەکەی راگرت بۆ منداڵەکە، منداڵەکەش توند دەستی پێوەگرت، ئنجا ئارۆز دارشەقەکەی راکێشاو منداڵەکەی رزگارکرد. بەم رووداوە دارشەقەکە زۆر دڵخۆشبوو، ئارۆزیش لە بایەخی دارشەقەکە تێگەیشت و بڕیاری دا زۆر ئاگاداری بێت نەکا بشکێت.




وێنه: سه‌رتیپ فه‌تاح


كڵاو


مایك


مه‌شخه‌ڵ


كاڵه‌ك


ئوتو


ددان


به‌له‌م


بیبه‌ر


مزراح


تور




گوڵ

له‌ نابلۆكه‌ی سه‌ره‌وه‌دا ئه‌م وێنانه‌ بدۆزه‌ره‌وه‌.

# مەرەکەب وەشێن

گیاندارێکی دەریاییەو لەخێزانی ( بێ بربرەکان ) ە. لە ئاوە تەنکاوەکانی ناوچەی کەمەرەی زەوی و کەنار دەریاکانی ناوچە مامناوەندەکانی گۆی زەویدا دەژی، بەڵام لە وەرزی زستاندا کۆچدەکات بۆ نێو ئاوە قوڵەکان. گیاندارێکی نەرم و لینجەو شێوەی لەشی هێلکەییە. سەری لە خوارەوەیە و پەلەکانی لەسەرەوەن. درێژی لەشی لە نێوان ( ١٥-٦١ ) سانتیمەتردایە. ( ١٠ ) پەلی هەیە، دوانیان لەوانی دیکەی درێژترن و بۆ گرتنی نێچیر بەکاریاندێنێت. چاوەکانی پێڵویان نییە. دوو پەری بچوکی هەیە کە بۆ هاوسەنگی لەشی بەکاریاندێنێت. کاتێک لە مەترسیدا دەبێت شلەیەکی قاوەیی دەرژێنێت کە لە مەرەکەب دەچێت، بۆیە پێی دەوترێت مەرەکەب وەشێن. لە ئاویشدا بە خێراییەکی زۆرو لەپڕ لە شوێنی خۆیدا دەردەپەرێت، بۆیە لە هەندێ شوێنیش پێی دەوترێت ( تیری دەریا ). خۆراکی سەرەکی گیاندارانی وەک قرژاڵ، رۆبیان، ماسی و هەشت پەل ( ئۆکتۆپەس )ە. بۆ خۆشی نێچیری هەندێ گیانداری وەک دۆلفین و کۆسە ( قرش )ە و مرۆڤیش بە مەبەستی خواردنی و بەدەستهێنانی ئەو رەنگەی کە لە لەشیدایە راویدەکات.



ئا: دیلان

# کاتێ ڕەشەبا ئاوڕ دەداتەوە



ئەو ئێوارەیە، سروە گۆڕاو ڕەشەبا جێیگرتەوە. پەپوولە جێماوەکە سەرما تەنگی پێهەڵچنی و ڕەشەباکەش تا دەهات بە گورتردەبوو. گوڵە هێرۆکان چاویان لە پەپوولەکە بوو، دڵیان بۆی سوتاو بانگیانکرد: پەپوولەی ڕەنگین، وەرە لای ئێمە تا بتپارێزین. پەپوولەکە بە دەنگە نزمەکەی وەڵامی دانەوە: ئاخر ئێوە وەک من ناسکن. هیچ لایەکمان بەرگەی هاژەی ئەم ڕەشەبایە ناگرین. گوڵە هێرۆکان وتیان: ئێمە لە ناو پەڕەکانماندا جێت دەکەینەوەو ناهێڵین سەرما کارت تێبکات. گەر ڕەشەباش ئازاری داین با پێکەوە هەڵوەرین و بژاکێین.



پەپوولەکە تا گەیشتە لای گوڵە هێرۆکان، پارچەیەک لە باڵەکانی هەڵوەری. گوڵەکان خێرا باوەشیان بۆ گرتەوەو بە هێواشی دایانپۆشی. کە ڕەشەباکە ئەم دیمەنەی بینی، ئاوری لێدانەوەو وردە وردە هێور بووەوەو ئارامی لەدوای خۆی بەجێهێشت. ئیتر گوڵەکان چاویان کردەوەو وەک جاران پرشنگیان دایەوە. پەپوولەکەش هەستایەوەو دووبارە بەسەر گوڵەکاندا هەڵفڕی و لەبەرخۆیەوە وتی " خۆزگە هەموو ڕەشەبایەک، وەک ئەم ڕەشەبایە ئازارەکان کاریان تێدەکردو دڵنەرم دەبوو " .



ئەحمەد حسێن: ئەحمەد

# شاری یاری





به ڕاستەیەک درێژی هەر دیارییەک بپێوە، بۆ ئەوەی بزانی کامیان لە هەموویان کورتترە.

بۆشاییەکان بەم پیتانە پڕبکەرەوە، تا ڕستەکەت بە تەواوی بۆ دەربچێت.

ز ێ ا ی ر

س ا ڵ ن و ت ن پ ب ت ۆ



کۆی کێشی ژمارەکانی کاملا زیاترە؟








یارمەتی بەهرۆز بدە، بگاتە دارەکە.





یەکێک لە پیتەکان لەناو خشتەکانی تردا دووبارە نەبۆتەوە، کامەیە؟



ئەم تابلۆیە ڕەنگ بکە.

# بێچووە ورچەکەی جەژنی سەری ساڵ



ساڵانێکی زۆر بەر لە ئێستا بێچووە ورچێک هەبوو ناوی خڕێ بوو. خڕێ حەزیدەکرد هەموو شتێک بزانێت! ئەو لە ئەشکەوتێکی گەورەدا لەگەڵ دایک و باوکیدا دەژیا. شەوێک دایکی پێی وت: ئازیزەکەم، ئێستا زستانەو هەوا ساردە، پێویستە زوو بخەویت. خڕێ زۆر بە پەرۆش بوو بزانێت زستان چییە! ئەو ئەبێت هەر بیزانێ! بە سکەخشێ لە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوەو بەرەو دارستانەکە کەوتەڕێ.



خڕێ بە بۆنکردن و لوتخشاندن رۆیشت تا گەیشتە لای ماڵێک. بە دەنگی بەرز وتی: ئەمە چییە؟ دارسنەوبەرێک وەڵامی دایەوە: ئەوە ماڵە. خڕێ بە پەرۆشەوە پرسی: تۆ کێیت؟ دارسنەوبەر وتی: من هەمیشە سەوزم. ئنجا بە لقێکی ئاماژەی کرد: ئەوانەش خەڵکن. ورچە بچکۆل لەوەو پێش خەڵکی نەدیبوو. ئەوان سەیربوون! تووک و فەرویان نەبوو. لەباتی چوار قاچ، لەسەر دوو قاچ دەڕۆیشتن.



هەمیشەسەوز هەموو شتێکی دەربارەی مرۆڤ و زستان دەزانی. ئەو وتی: من تەنها رووەکم کە هەمیشە بەئاگام و هەموو زستان دەبینم. سەهۆڵ! بەفر! لە هەمووشی خۆشتر جەژنی سەری ساڵ دەبینم! خڕێ وتی: جەژنی سەری ساڵ چییە؟! هەمیشە سەوز وتی: جەژنی سەری ساڵ زۆر خۆشە. خەڵکی ماڵەکانیان دەرازێننەوە. خڕێ لە پەنجەرەکەوە روانی و وتی: دڵخۆشم کە لە جەژنی سەری ساڵدا بەئاگام. هەمیشە سەوز وتی: جەژنی سەری ساڵ خۆشتریش دەبێ.



خڕێ کە حەزی لە گۆرانی بوو، وتی: من دڵخۆشم کە جەژنی سەری ساڵم لە دەست نەچووە. هەمیشە سەوز پێکەنی و وتی: جەژنی سەری سال خۆشتریش دەبێ! خەڵکی شیرینی دروست دەکەن. خڕێ کە بۆنی شیرینیەکەی کرد، هاواریکرد: حەزم لە جەژنی سەری ساڵە.
هەمیشەسەوز وتی: جەژنی سەری ساڵ خۆشتریش دەبێ! خەڵکی دیاریی پێشکەشی یەکتری دەکەن، بەمەش زیاتر هەست بە خۆشی سەری سال دەکەن. خڕێ لەبەر خۆیەوە وتی " خۆزگە منیش هەستم بە خۆشی سەری ساڵ دەکرد" ئەم قسەیە شتێکی بە بیری درەختەکەدا هێنا.



ڕۆژی دواتر خڕێ بوکەڵەیەکی لە ژێر لقەکانی هەمیشە سەوزدا دۆزییەوە. پرسیاریکرد: ئەمە بۆ منە؟ هەمیشە سەوز سەری بەڵێی لەقاند. خڕێ دیارییەکەی کردەوەو هاواریکرد: زۆر جوانە! هەمیشە سەوز هەستی بە خۆشی جەژنی سەری ساڵ کردو وتی: باڵندەکان یارمەتییان دام تا بۆتی دروست بکەم. خڕێ توووند بووکەڵەکەی گرتە باوەشی و وتی " ئێستا دەزانم جەژنی سەری ساڵ چییە"



ڕۆژی دواتر کاتێک خڕێ گەڕابۆوە ماڵی خۆیان، تێگەیشت کە ئەو هەڵە بووە. بیری کردەوە "پێویستە منیش دیارییەک بۆ هەمیشە سەوز بدۆزمەوە" سەیری دەرەوەی ئەشکەوتەکەی کرد، باران تک تک دەباری. ورچە بچکۆلە دەتوانێت چی بکاتە دیاریی هەمیش سەوز؟ کتوپڕ هەورەکان پەرش و بڵاوبوونەوەو پەلکە زێڕینە دەرکەوت. ئەوەندە جوان بوو! خڕێ بیری کردەوە " ئەمە دیارییەکی تەواو دروستە بۆ هەمیشە سەوز" خڕێ ڕایکرد تا پەلکە زێڕینەکە بگرێت.



خرێ سەیریکرد پەلکەزێڕینەکە لەناو گۆلاوێکدا بەستویەتی و دەدرەوشێتەوە. خێرا پەلکەزێڕینە بەستووەکەی هەڵگرتەوەو لە گۆلاوەکەی دەرهێنا.



ورچە بچکۆل نەیدەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕێ بکات، دیارییەکەی هەڵگرت و بردی بۆ هەمیشە سەوز، بەڵام کاتێک گەیشتە لای هاوڕێکەی، کەوت و پەلکەزێڕینەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە. خرێ بەگریانەوە هاواریکرد: دیارییەکەتم شکاند!



هەمیشە سەوز وتی: بەڵام هێشتا هەر جوانە. خرێ سەرنجی هەمیشە سەوزی داو بە سەرسورمانەوە وتی: ئێستا تۆ رەنگینترین رووەکیت لەجیهاندا. لەو کاتەدا بابەنوئێل دەرکەوت و وتی: چەند درەختێکی جوانی! بڕوام وایە تۆ درەختی جەژنی سەری ساڵ بیت. ئیتر لەو کاتە بەدواوە هەموو هەمیشە سەوزەکان بوونەتە درەختی سەری ساڵ و هەموو ورچە بوکەڵەکانیش بوونەتە دیارییە پەسەندەکەی دەستی بابەنوئێل.

گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە: ئازاد تەها عەلی

# پـــاوە

## نیشتمانەکەمان بناسین



پاوە، شارێکی دڵگیری رۆژهەڵاتی کوردستانەو سـەر بە پارێزگای کـرماشانە. دراوسێی شـارەکانی مەریوان و روانسەرو جوانرۆیە. لـەبەر ئەوەی کەوتۆتە کوێستانەکانی هەورامانەوە، کەشوهەوایەکی خۆشی هەیەو هـەڵکەوتەی خانووەکانیشی بە قەدپاڵی چیاوە، کە شێوەی قادرمەی پێ بەخشیوە، جوانییەکی زیاتری داوەتە شارەکە. پاوە شارێکی دێرینەو مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ پێـش ئاینی زەردەشت. ئەم شارە بەر لە هاتنی ئاینی ئیسـلام ناوی ( فاوج ) بووە. ئێستا هەندێ گوندی وەک دورسان، نۆسمە، بەندەرە و نۆریاوە بە هۆی گەورەبوونی شاری پاوەوە بوون بە بەشێک لە شارەکە.

ئا :ئاوارە

## لە وەرزی زستاندا چی دەکەین؟



لە وەرزی زستاندا کە چووینە دەرەوە ، ملپێچ، کڵاوی خوری، بلوزی خوری، قاپوت و جلوبەرگی ئەستور دەپۆشین.

لە وەرزی زستاندا، بە بۆنەی کۆتایی ساڵ و هاتنی ساڵی نوێوە ئاهەنگ دەگێرین.

لە وەرزی زستاندا، هێندە ناچینە دەرەوە، زیاتر لە ژوورەوە دەمێنینەوە تا داپیرە چیرۆکمان بۆ بگێرێتەوە.

لە وەرزی زستاندا، گوێ لە دەنگی هەورە گرمە دەگرین.

لە وەرزی زستاندا ، چێژ لە سەیرکردنی بەفرو باران وەردەگرین کاتێک دەبارێن.

و. لەعەرەبییەوە :سروە مەحموود



ئەکیرا میاگاوە



# ئیمیلی









**ناوی ئەنیمی: ئیمیلی**
**Emily of New Moon**
**نوسەر: لوسی مەود مۆنتگەمێری**
**وێنەکێش: کانای کوماتسو -کەیزۆ شیمیزو**
**میوزیک : ئەکیرا میاگاوە**
**دەرهێنەر: هارومی کۆساکا**
**جۆری ئەنیمی: پەروەردەی و مێژوویی**
**ماوە: ٢٦ ئەڵقە**
**ساڵی بەرهەمهێنان: ٢٠٠٧**
**کۆمپانیای بەرهەمهێن: TMS – NHK**



### ئیمیلی

تەمەنی ١١ ساڵە. دەیەوێت ببێتە هۆنەرو نوسەر.



### ساوسی سال

پشیلەکەی ئیمیلییە.

### کورتەی چیرۆکەکە:

پاش کۆچی دوایی باوکی، ئیمیلی دەچێتە دورگەی ( شازادە ئێدوارد) تا لەوێ بژی. پوری کە لە بنەماڵەیەکی ناوداری ئەو دورگەیەیە، دەیگرێتە خۆی. پاش ماوەیەک ئیمیلی چەند هاورێیەکی نوێ دەگرێت کە بەشێکی زۆری کاتەکانی لەگەڵ ئەواندا بەسەر دەبات. هاورێکانی هەر یەکەیان خولیاو ئاواتی خۆی هەیە. ئیمیلیش دەیەوێت ببێتە هۆنەرێکی ناودارو هەندێک جار لەگەڵ سروشتدا خەیاڵی تێکەڵ دەکات و هۆنراوە دەنوسێت، بەڵام لە لایەن پورییەوە رێگری لێدەکرێت بۆ دەرخستنی تواناکەی. هەرچەندە ئیمیلی پۆی روندەکاتەوە، بەڵام ئەو لە مەبەستی تێناگات. پاش هەوڵدانێکی زۆر لە قوتابخانە تواناکانی دەردەکەوێت و پوری لەو کردارانەی پێشووی پەشیمان دەبێتەوە. لە کۆتایدا هاوسەرگیری لەگەڵ (تێدی) هاورێیدا دەکات و سەرجەم خەونەکانیان بەدی دێنن.





## ئەلیزابێس

پوری ئیمیلییە، بیرو بۆچونەکانی پێچەوانەی ئیمیلیین.



## ئیلیز

کچی پزیشکی دورگەکەیەو هاورێی نزیکی ئیمیلیە. ئیمیلی نازناوی (سوزی) بۆ دادەنێت.



## بێری

هاورێی یەکەمی ئیمیلییەو لە ئیشوکاردا چالاکە.



## تێدی

کەسێکی هێمنەو دەیەوێت ببێتە وێنەکێش. کە گەورە دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵ ئیمیلیدا دەکات.



## رۆزا

لە پۆلەکەی ئیمیلییە. زۆرجار گرفت بۆ ئیمیلی دروست دەکات.













## جێمی

ئامۆزای ئیمیلییەو لەوماڵەدا دەژی کە ئیمیلی تێدایە.



## لاورا

خوشکی ئەلیزابێسە. کەسێکی دڵنەرم و لەسەرخۆیە.



## کارپێنتەر

مامۆستای قوتابخانەکەیەو لای قوتابیان زۆر خۆشەویستە.

# دەست و چاوتان خۆش

وێنە: ئیسماعیل عومەر حەسەن



لەنیا ئاریان لەتیف
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی ئەمین زەکی بنەڕەتی



## ڕێزگرتن لەدایک و باوک

سڵاو بۆ خامەی سەر کاغەز
کە فێری ئەلف و بێی کردم
بەکوردی و هەم بەسۆزی خۆی
نەزان بووم فێری ڕێی کردم
بە ئامۆژگاری هەرکاتێ
کەلام دابێ، منی بەخشی
لەکاتێکا تاریکی چاوەڕێی کردم
دڵسۆزیی دایە بابەم بوو

تەمەنیان بۆ گەشەم دانا
خەونیان بوو ئایندەی من
مرۆڤی زۆر ژیرو دانا
دەسا لە ڕێگەی خوێندنا
گەر تەمەنم گشت دانابێ
پاداشتی دایەو بابە گیان
هەرگیز لە لای من ون نابێ

---



## پەڕاوەکەم

پەڕاوەکەم زۆر جوانە
لێی دەنووسم ڕۆژانە
خەتی ڕەش ڕەشی تیایە
نوسینی ڕێکی تیایە
پاکو خاوێن رایدەگرم
زانستی لێوەردەگرم
پەڕاو پێنووسەکەم
هیچ کات لەیادیان ناکەم



بانوو مستەفا حسین
تەمەن/ ١٢ساڵ
خانەی نەورۆز بۆ ڕۆشنبیری منداڵان

---

## ورچۆڵە

شاد یوسف خەلیل
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی دێرینی بنەڕەتی



بێچووە ورچێک دەبێت زۆر نەوسن دەبێ و حەزی زۆر لە هەنگوین دەبێت. ڕۆژێک چاوی بە ماڵی هەنگ دەکەوێت و لە دڵی خۆیدا دەڵێت " ئای لەم هەموو هەنگوینە. ئێستا نەچیت هەمووی بخۆیت!" لەم قسانەدا بوو هەنگەکان هاتنە دەرەوە بۆ مژینی گوڵەکان ئەمیش بە فرسەتی زانی و چوو هەموو هەنگوینەکەی برد. کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دایکی زۆر سەرزەنشتی کرد، هەنگوینەکەی لێسەندو بردییەوە بۆ هەنگەکان. ئەوانیش وتیان: زۆر سوپاس بۆ تۆ دایکە ورچ، بەڵام تکایە ئەم تۆزە هەنگوینە بەرەوە بۆ ورچۆڵە جوان، چونکە حەزی لێیەتی.



# دەست و چاوتان خۆش



لانە سەلاحەدین/(١٠) ساڵ - سلێمانی



لازیا ئاسۆ/(٩) ساڵ - سلێمانی



کۆژین فەرهاد/(١١) ساڵ - سلێمانی



زەیتون سەلاح/(١٢) ساڵ - بازیان



عوسمان/(٧) ساڵ - سلێمانی



بانە ئەحمەد/(٨) ساڵ - سلێمانی

# HAWRÊY MEREKAN

Beyanîyekî pişûy hawîn, malî Kawe be dênî çûn bo ladê. Kawey biçkole zor dilî xoşbû, çunke eywîyist legel merekan da bibê be hawrê, boye her ke geyiştne naw gundeke, xêra çuwe naw rane merêkewe û legel merekan da destîkrid be qisekirdin. Bawkî daye qaqay pêkenîn û pêywit: Kawe giyan, ewe qise legel kê ekey? Kawe witî: legel merekan. zor hezekem legel merekan qisebikem.



Bawkî be xendewe witî: belam merekan le to tênagen, ewan tenha le zimanî xoyan têdegen. Kawe witî: belam min hezekem bibme hawrêyan. Bawkî witî: to etwanît legel merekan bibît be hawrê, belam be corêkî tir. Kawe pirsî: babe giyan, çon? Bawkî witî: biyanbe bo lewerge, ta têr giya bixon, bemeş debîte şwanêkî baş, şwanîş wate hawrêy merekan. Kawe be dilêkî xoşewe witî: ey giyan.. ca lewe asantir heye, her êsta eyanbem bo lewer, belam bexwa têbigen û tênegen min her qiseyan legel da ekem.

*Şadan Qadir Emîn*
*Latînî: Salih Bêçar*



Ẍ غ | r̈,R̈ ڕ | v ڤ | J,j ژ | L,l ل | F,f ف | C ج | Ḧ,ḧ ح | H h ه | X خ | Ç چ | Î ێ،ی | m,M م | b,B ب | y,î ی | W,u و

O و | ş ش | s س | Q,q ق | L̈ l̈ ڵ | N ن | g,G گ | A,a ئا،ا | ê,Ê ێ | K ک | r,R ر | eE ە | D,d د | Z ز | P پ | T,t ت | û,Û وو